مەرجەکانی

# لا إلـه إلا الله

ڕاڤەکردنی

مامۆستا طارق شاخەوان(الله تعالى بیپارێزێت)

**نوسین و ئامادەکردنی**

***عبدَالله الكردي***

٦/١٤٤٤ی ڕەمەزان

پێشەکی نوسەر:

بسم الله الصلاة والسلام على أشرف خلقه نبينا وقائدنا محمد وعلى آله وصحبه، ومن دعا بدعوته وصار على هده وستن بسنته الى يوم الدين أما بعد فإن أصدق الحديث كلام الله وخير الهدي هدي نبينا محمد صلى الله عليه وسلم.

برايان و خوشکانی قەدر گرانم الله تعالى هەموو لایەك سەر بەرز بکات و لێمان خۆشبێت، ئەم نامیلکەیە باس لە مەرجەکانی لا إله إلا الله دەکات بە شێویەکی زۆر جوان کە مامۆستا طارق شاخەوان الله تعالى بیپارێزێت لە وتارێکدا باسی کردووە و منیش بە پێویستم زانی کە بینوسمەوە بۆ ئەوکەسانەی کە ئارەزوی خوێندنەوەیان هەیە، وە داواکارم لە الله تعالى کە بیکاتە مایەی لێ خۆشبونی تاوانەکانم و بیکاتە توێشویەك بۆ قیامەتم آمین

وصل الله على محمد وعلى آله وصحبه وسلم

# مەرجەکانی لا إله إلا الله

**بسم الله الرحمن الرحيم :**

لا إله إلا الله هي كلمة فارق بين الكفر والإيمان وتنی لا إله إلا الله تۆ لە دائیکرەی کوفر دێنێتە دەرەوە و ئەتهێنێتە ناو دائیرەی ئیسلامەوە، بەڵام هەندێك مەرجی هەیە پێویستە بوونیان هەبێت تێیدا.

لا إله إلا الله ئەو شەیەیە کە تەواوی پێغەمەران بۆ ئەوە نێردراون لە ئادەمەوە هەتاوەکو خاتەم علیهم الصلاة والسلام، ئەو وشەیەیە کە پەروەردگار کەون و کائینات لەپێناو ئەم وشەیەدا دروستکردووە کە لا إله إلا اللهیە.

گەورەیی ئەم وشەیە ئەوانە دایزانن کە بە ڕاستگۆیی و مخلص‌یەوە لە دڵیانەوە هاتووە و دەیڵێن.

(لا إله إلا الله مفتاح الجنة، ولكل مفتاح أسنان) واتە: لا إله إلا الله کلیلی بەهەشتە، وە هەموو کلیلێك دانی هەیە، بۆ ئەوەی ئەم کلیلە ئەم دەرگایە کاتەوە کە بۆی دروست کراوە، کەوایە هەموو کلیلێك هەموو دەرگایەك ناکاتەوە، ئەو کلیلە ئەگەر ئەو ددانانەشی پێوەبێت بەڵام نوقسانیەك و هەڵەیەکی تێدابێت، ئەوا ئەم کلیلە ناتوانێ ئەم دەرگایە بکاتەوە، کەواتە مەرج نییە هەموو ئەوانەی ئەم کلیلەیان پێبێت بەئاسانی ئەم دەرگایە بکەنەوە، بەڵکو دەبێت مەرجەکانی تێدا بوونی هەبێت.

وتنی لا إله إلا الله ئاسانە بەڵام جێبەجێکرن و بوونی مەرجەکان لەکەسێکدا هەروا ئاسان نییە، بەداخەوە کە هەندێك هەڵخەڵەتێنەر و چەواشەکار، کە زۆر بە ئاسانی و بە سادەیی بەخەڵکیان گەیاندووە، بەڵێ ئێمە هەموو هەوڵێك و جوهدێکمان ئەوەیە کە خەڵك ئەم وشەیە بڵێت و لە تاریکستانی کوفر و جەهل بێتە دەرەوە و بێتە ناو ئیسلامەوە و موسڵمان ببێت، بەڵام دەبێت تێشی بگەیەنین کە ئەم لا إله إلا اللهیە وتنی تەنها بە زمان نییە و تەواو، مەرجی هەیە.

ئەم هەڵخەڵەتێنەرانە وا هاتوون ئەوەندە ئاسانیان کردووە کە هەرکەسێك بڵێت لا إله إلا الله ئیتر تەواو ئەوە موسڵمانە، بەڵام لەڕاستیدا ئەو کەسە ئەگەر مەرجەکانی تێدا نەبێت موسڵمان نییە، ئەوە خەیاڵ پڵاوی بۆ خەڵکی کردووە، خەڵك خەڵەتاندنە و خیانەت کردنە لە وشەی لا إله إلا الله و خیانەت کردە لەو خەڵکەی کە بەقسەی دەکات و بە قسەکەی ئەو هەڵخەڵەتاوە، بە ئیرجائەکەی ئەو هەڵخەڵەتاوە، ئەمانە پێیان دەوترێت ( المرجئة ) ، دەڵێن تەنها بە زمان بڵێیت لا إله إلا الله ئەوا تۆ تەواو تۆ ئیمانداریت و تۆ موسڵمانیت.

مورجیئەکان دەڵێن : (الإمان قول باللسان) واتە: ئیمان ئەوەیە کە تۆ بەزار بڵێیت لا إله إلا الله (لا يضره ترك العمل) ئەوکاتە ئەگەر تۆ وتت لا إله إلا الله هیچ کار و کردەوەکی باشیش نەکەیت زیانی

نییە، (وفعل المعصية مع الإيمان) كردنی تاوان هیچ زەرەرو زیانێك بە ئیمانەكەت ناگەیەنێت (ونواقض الإسلام) هەڵوەشێنەرەوەكانی ئیسلامیشت تێدابێت تۆ هیچ زیانێكت پێ ناگات مادام تۆ بە زمان وشەكەت وتووە.

بەڵام ئەهلی سونەت و جەماعەت وا نین و دەفەرمون : (الإيمان تصديق بالقلب وقول باللسان و عمل بالجوارح) ئیمان بریتیە لەوەی كە تۆ بە زمان بیڵێیت و بە ڕاستی بزانیت لە دڵتدا و بە كردەوەی لاشەتیش بیسەلمێنیت، هەر بۆیە خوای گەورە لە قورئاندا هەمیشە فەرمویەتی ( ألذين آمنوا و عملوا الصالحات)، كەواتە تەنها باوەڕبوون شەرت نییە بەڵكو دەبێت كارو كردەوەی باشیشت هەبێت، كەواتە ئیمانی ڕاست و دروست ئەوەیە كە تۆ مەرجەكانی لا إله إلا اللهت تێدا مەوجودبێت، خوای تعالی ئەفەرمویێت: {**فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا**}([1]) [النساء : 65] سەیركەن ئەوەی كە ئیمانی هێناوە با حەفتا هەزار جار وتبێتی لا إله إلا الله، خوای گەورە دەفەرموێت سوێند بە پەروەردگاری تۆ ئەی محمد ﷺ ، ئیمانیان نییە هەرچەندە ئەگەر وتبێتیان لا إله إلا الله محمد الرسول الله، هەتا تۆ نەكەن بە حەكەم هەتا قورئان نەكەن بە حەكەم هەتا حەدیثەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ نەكەن بە حەكەم، (**وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا**) دەبێت تەسلیمیش بن، ئەگەرنا ئیماندار نین، كەواتە لا إله إلا الله مەرجی هەیە و تۆ ئەبێت لەسەری بەردەوامبی لە ژیانتدا هەتاوەكو دەمریت لەسەری، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی ( من كان آخر كلامه لا إله إلا الله دخل الجنه)([2])، واتە : هەركەسێك لەسەر لا إله إلا الله بەردەوامبێت و كۆتایین وشەی لە دنایادا لا إله إلا اللهبێت، ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە.

## 1. مەرجی یەكەم لە مەرجەكانی لا إله إلا الله : **العلم بعناها**

تۆ دەبێت واتای لا إله إلا الله بزانی، نابێت نەزانی كە لا إله إلا الله یانی چی، كاتێك كە ئینگلیزێك، یابانیەك، كۆریەك، كاتێك كە موسڵمان دەبێت پێتان وایە هەروا بە ئاسانی و بەبێ ئەوەی بزانێ واتای لا إله إلا الله چییە موسڵمان دەبێت!!! بەبێ ئەوە بزانێ ئیسلام چییە و چی لێ داوا ئەكات ئیمان دێنێت؟ بێگومان نەخێر، زۆر بەباشی لێی ورد دبێتەوە و دەزانی واتای لا إله إلا الله چییە، ئەوجا موسڵمان دەبێت، هەر بۆیەشە موسڵمان بوونەكەی ئەوان زۆر زۆر باشترێكە لەوەی ئێمە، بۆیە ئەوانەی كە تازە موسڵمان دەبن و پێشتر كافر بوون، كاتێك كە موسڵمان دەبن زۆر لە ئێمە باشترن چونكە زۆر لە ئێمە باشتر تێیدەگەن، هەتا تێینەگەن ئیمان ناهێنن، هەتا نەزانن لا إله إلا الله یانی چی هەروا بەئاسانی نایڵێن، بەڵام ئێمە هەموو ڕۆژێك دەیڵێین و نازانین واتای چییە، دەڵێین لا إله إلا الله

---

(1) سورة النساء آية ٦٥.

2) سنن أبي داود | كتاب الجنائز باب في التلقين (حديث رقم: ٣١١٦ )

بەڵام لەولاوە دەیان هەڵوەشێنەرەوەی لا إله إلا اللهمان تێدایە، مەرجەکانمان تێدا مەوجود نییە، بۆیە دەبێت تۆ علم و زانستت پێی هەبێت،

موشریکەکانی سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بەباشی دەیانزانی وشەی لا إله إلا الله چییە بۆیە نەیان دەگوت، زۆر لە موسڵمانانی ئەم سەدەمە باشتر دەیانزانی لا إله إلا الله چییە بۆیە ملیان نەدەدایە و موسڵمان نەدەبوون و ئیمانیان نەدەهێنا، ابو جەهل و عوتبە و شەیبە ئەگەر وەکو ئەوەی ئێستا کە ئاوا ئاسانکراوە بەس بڵێ لا إله إلا الله ئەوا تەواو تۆ نەجاتت بووە، ئەگەر وابوایە ئەوە ابو جهل و عوتبە و شەیبە موسڵمان دەبوون ئەگەر تەنها وتنی بە زمان بوایە، بەڵام لا إله إلا الله واتاکەی زۆر گەورەیە، واتە :( **لا معبود بحق إلا الله** )، هەر پەرستراوێك کە دەپەرسترێت یاخود هەرکەسێك کە خۆی کردبێت بە خوا و خەڵك دەیپەرستێت، یان بە هەر جۆرێك دەپەرسترێت و گوێڕایەڵی دەکرێت، من بڕوام پێی نییە و بە خوای نازانم و بە شیاوی ئەوەی نازانم کە گوڕایەڵی بکەم و بیپەرستم و هاواری لێ بکەم جگە لە زاتی الله نەبێت، لا إله إلا الله واتە {**فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ لَا انفِصَامَ لَهَا ۗ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ**}[(3)] ، هەرکەسێك بڕوای بە طاغوتەکان نەبێت بەڵام بڕوای بە الله هەبێت( **فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ** ) عروة الوثقي واتە لا إله إلا الله، ئەو کاتە تۆ لا إله إلا اللهت تێدا مەوجودە کە هەرچی دەپەرسترێت جگە لە الله وە ڕازیبێت بەو پەرستنە ، ئیمانت پێی نەبێت و بەکافری بزانیت وە ئەوانەش بەکافر بزانی کە دەیپەرستن، بەڵام ئەگەر ئەوکەسەی کە دەپەرستێت ڕازی نەبێت بەو پەرستنەی کە بۆ دەکرێت ئەوە نابێت بە طاغوت ، بەڵام ئەگەر کەسێك بێت و حوکمیان بکات و خۆی کردبێت بە خوا، خەڵکی بیپەرستێت و گوڕایەڵی بکات، ئەوانە کراون بە طاغوت، ئیماندار دەبێت باوەڕی بەو شتانە نەبێت، لا إله إلا الله واتە : (**أن تُوَحّدَ الله بِالرُّبُوبِيَّةِ والأُلُوهِيَّةِ والأَسْماءِ والصفات** ) ئەوە کە بڵێی پەروەرگاری من و بەدیهێنەری من و کەون و کائینات تەنها اللهیە، ئەوەی کە بپەرسترێت و گوێڕایەڵی بکرێت و حوکم دابنێت تەنها اللهیە، ئەوەی کەوا أسماءی حسنای هەیە تەنها اللهیە، ئەوەی کە صیفاتی علیی هەیە و صیفاتی کەمالی هەیە تەنها اللهیە، ئەوکاتە تۆ ئیمانداری، ئەمە واتای لا إله إلا الله.

2. **دووەم مەرج لە مەرجەکانی لا إله إلا الله بریتیە لە اليقين:**

ئەوکاتەی کە تۆ دەیڵێیت و علمت پێی هەبوو پێویستە بە یەقینەوە بیڵێیت و نابێت شك و گومانت هەبێت ئەوانەی کە شك و گومانیان هەیە ئەوانە موناڧیقەکان و دوو ڕووەکانن {**إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ**}[(4)]

---

[(3)] سورة البقرة آية ٢٥٦.

(4) سورة الحجرات آية ١٥.

ئیمانداران تەنها ئەوانەن کە ئیمانیان بە الله هەیە جل جلاله، وە ئیمانیان بە پێغەمبەرەکەی هەیە ﷺ [ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا] پاشان هیچ گومانێکیان بۆ دروست نابێت، هەر ڕۆژەو لەسەر کەڵەکێك نییە، هەر ڕۆژەو لەسەر بیروباوەڕێك نییە، کە وتی الله هەیە و بڕوام پێیەتی و پێغەمبەری هەیە و بڕوام پێیەتی، ئەوەی کە ئەوان فەرمویانە بڕوام پێیەتی [ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا ] گومانیان بۆ دروست نابێت، ئەوەیشی لە واتای لا إله إلا الله تێنەگەشتبێت و یەقینی نەبێت و گومانی هەبێت، لەناو قەبردا ئەوە تەنها کافر نییە کە نازانێ و ناتوانێ وەڵامی مەلائیکەتەکان بداتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت [ أما المرتاب ] ئەوەی کە گومانی هەیە، ئەوەی کەوا لە یەقیندا نەژیاوە لە حەیاتیا واتای لا إله إلا الله بەباشی وەرنەگرتووە و یەقینی نەبووە، لەناو قەبردا کاتێك کە پرسیاری لێ دەکەن [ من ربك ، ما دينك ، من نبيك ، فيقول ها ها؟ لا أدري ، سمعت الناس يقولون شياً فقلته ][5] دەڵێ هاها نازانم، چونکە لە گوماندا بووە[ أما المرتاب ] ئەوەی لە گوماندا بووە جگە لە کافر ، دەڵێ دەمبیست خەڵك شتێکیان دەوت، خۆ منیش دەموت بەڵام ئێستا نازانم چی بووە و لەبیرم چوەتەوە.

أبو هريرة رضي الله عنه دەفەرموێت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی [ من يشهد أن لا إله إلا الله مستيقنا بها قلبه، فبشره بالجنة ][6] واتە هەرکەسێك وتی لا إله إلا الله بە دڵ دەیوت و دڵی یەقینی هەبوو لەو وشەیەی کە دەیڵێت ئەوکاتە ئەوە موژدەی بدەرێ کە ئەهلی بەهەشتە.

[من قال أشهد أن لا إله إلا الله و أشهد أنّ محمد رسول الله غير شاك فيهما دخل الجنة ][7] هەرکەسێك ئەم دوو وشەیە بڵێت هیچ شك و گومانێکی نەبێت لە وتنیاندا و مەرجەکانی تێیدا مەوجودبێت ئەویە دەچێتە بەهەشتەوە.

### 3. سێیەم مەرج تر لە مەرجەکانی لا إله إلا الله بریتیە لە **القبول** :

بەو مەرجە تۆ لا إله إلا اللەکەت قەبوڵە و ڕاستگۆی تێیدا ئەگەر بێت و هەرچی ئەوی کە لا إله إلا الله لێت داوا دەکات قەبوڵتبێت، یانی نابێت تۆ خۆت بە گەورە بزانیت و استکبار بکەیت، واتە تۆ لەملاوە بڵێیت لا إله إلا الله بەڵام لەولاوە لا إله إلا الله فەرمانی شتانێکت پێ بکات و تۆ ئەو شتانەت تێدا مەوجود نەبێت، جێبەجێی نەکەی و ئینکاری بکەیت، تەکەبور بکەیت، پشتی تێ بکەی.

موشریکەکانی سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموویان هەتا ئێرە ئیمانیان هەبوو بەڵام ئەلێرە لەگەڵ ئیماندارانی ڕاستەقینە جیادەبنەوە یانی هەم موشریکەکان قوڕەیش و هەم فیرعونیش وە هەروەها

[5] صحيح الجامع |الصفحة أو الرقم ٥٧٢٢. / أخرجه البخاري ٢٦ ، ومسلم ٩٠٥.

(6) صحيح الجامع الصفحة او الرقم ٨٥٧ ، وأخرجه مسلم ٣١.

[7] صحيح الجامع صفحة او الرقم ١٠٠٩ / ، وأخرجه مسلم ٢٩.

ئیبلیسیش هەتا ئێرە ئیمانیان تەواوە، یانی عیلمیان هەبوو و یەقینیشیان هەبوو بەڵام لە قبولدا لە ئیمانداران ڕاستەقینە جیا دەبنەوە کە بەڕاستی دەڵێن لا إله إلا الله وە مەرجەکانیان تێدا مەوجودە.

ئیبلیس خۆی بەگەورەزانی واتە استکابری کرد، فیرعەون (عدم الإنقیاد)ـی هەبوو {**إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ**}[(8)] ئەگەر پێیان وترابا بڵێن لا إله إلا الله تەکەبریان دەکرد.

ئەگەر هەموو قورئانت لەبەربێت ئەگەر هەموو ڕۆژێك بەڕۆژوو بیت ئەگەر هەموو شەوێك شەو نوێژ بکەیت ئەگەر سەرت لە سوجدە بەرزنەکەیتەوە، بڕوات بە یەك ئایەتی قورئانی پیرۆز نەبێت ئەوە تۆ ئەو مەرجەی لا إله إلا اللەت تێدا مەوجود نییە و نەهاتویتە ناو ئیسلامەوە، سوێند بە الله ئەگەر بڵێیت هەموو قورئان بە کەڵکی ئەوەدێت حوکمی پێ بکەیت بەڵام تەنها یەك ئایەتی تێدایە کە بەکەڵی ئەوە نایات حوکمی پێ بکەیت، سوێن بە الله تۆ کافری و مورتەدی ڕەبتت بە ئیسلامەوە نییە، ئەمە بە دەلیلی قورئان و حدیثـی پێغەمبەری خوا ﷺ چونکە ئەمە بە کۆدەنگی ئوممەتی ئیسلامی ئەوەی یەك تۆز شارەزایی ئەو دینەی هەبێت بڵێت ئەوەی کە تۆ دەیڵێی وا نییە چونکە ئەمە دەیان بەڵگەی قورئان و حەدیثـی لەسەرە، بەس بڕوات بە یەك ئایەت نەبێت یان بڕوات بە یەك وشەی نەبێت.

کەواتە تۆ دەبێت قبولی ئەو دینەت بێت هەر لە سورەتی فاتیحەوە هەتاوەکو سورەتی ناس وشە بە وشەی ئەم قورئانەت قبول بێت و لەسەر سەرت و لەسەر چاوتی دابنێی ئەوکاتە تۆ لا إله إلا اللەت تێدا مەجودە ئەوکاتە تۆ ئەو مەرجەت تێدا مەجودە کە (قبول)ـە.

ئەگەر ئەمەت تێدا مەوجود نەبێت ئەوە بەخۆت و ئیمانتدا بچۆرەوە، ئەگەر حوکمێکی قورئانت قبول نییە ئەوە بە ئیمانتدا وەرەوە ، ئەو دڵەت ئیمانی تێدا نییە، بۆیە ئەم مەرجەیان یەکێکە لە مەرجە گەورەکان کە تۆ پێویستە ئەوەی کە لا إله إلا الله لێت داوا دەکات هەموویت قبول بێت.

{**إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ**}[(9)] سەیرکەن الله جل جلاله چی دەفەرموێت : دەفەرموێت: حەصرەن ئیمانداران ئەوانەن کاتێك بانگ بکرێن بۆ ئەوەی کە الله جل جلاله حوکمیان بکات، بۆ ئەوەی حوکمیان بە قورئان بکرێت، بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ حوکمیان بکات بڵێن [ **سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ** ]، ناکرێت بڵێت ئەو ئایەتەم بە دڵ نییە، نابێت بڵێت ئەو فەرمانەی پێغەمبەری خوام بە دڵ نییە ﷺ ، والله ئەوکاتە خوا دەفەرموێت تۆ ئیماندار نیت.

---

**(8)** سورة الصّافّات آية ٣٥

**(9) سورة النور آية ٥١.**

### 4. چوارم مەرج لە مەرجەکانی لا إله إلا الله بریتیە لە **الإنقیاد** :

واتە تەسلیمی ئیرادەی پەروەردگار بیت، هەرچی کە لە قورئان و حەدیثدا هاتووە تۆ قبوڵت بێت، کە پێچەوانەکەی حوکم بردنەوەیە بۆ لای طاغوتان، پشت کردنە ئەم دینەیە و کردەوە پێ نەکردنە.

خۆش باوەڕەکانی مورجیئە لێرەدا دەرناچن چونکە ئەوان دەڵێن ئیمان تەنها وتنی لا إله إلا اللهیە، ئەوانەی کە خۆش باوەڕن و بە قسەی مورجیئەکان، ئەوە نییە مامۆستا فلان و فلان کە سیماو شکلیشیان ئاوایە و پێیان وتوین تەنها بڵێن لا إله إلا الله ئیتر تەواو ئیتر بە حەزی خۆمان گوناهـ و تاوان دەکەین و بەحەزی خۆمان زوڵم و ستەم دەکەین چیمان بوێت دەیکەین بەس دەڵێین لا إله إلا الله تەواو نەجاتمان بووە.

بەڵام لە مەرجی الإنقیاددا کە دەبێت ئەویشت تێدا مەوجودبێت ئەلێرەدا دەرناچن و تێدەکەون.

خوا گەورە دەفەرموێت { **وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ ۗ وَإِلَى اللَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ**} [10] هەرکەسێك نێو چاوانی تەسلیمی الله بکات و بڵێت ئەی خوایە ئەوەی کە تۆ فەرمووتە ئەوەی کە بە پێغەمبەرەکەتدا ناردوتە سەرسەرو سەرچاوم ئەوە ئەوکاتە دەستت گرتووە بە [ **بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ** ] ئەوکاتە تۆ دەستت گرتووە بە پەتە قاییمەکەوە واتە لا إله إلا الله.

واتە تۆ تەواو تەواو تەسلیمی فەرمانەکانی پەروەردگار بیت [ **أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ۚ** ][11] ئەوانەی کە حوکم دەکەن ئایا ئێوە باوەڕتان بەهەندێك هەیە لەو قورئانە و باوەڕتان بە هەندێکی نییە!! بۆچی هەموو قورئان ناکەن بە حەکەم، یان ئەوای کە باشە و بە قازانجتانە حوکمی پێ دەکەن و ئەوەی تریان نا!!، خوای گەورە دەفەرموێت [ باوەڕتان بە هەندێکی ئەو قورئانە هەیە و باوەڕتان بە هەندێکی نییە ] کەواتە مەرجێکی لا إله إلا اللەت تێدا مەوجود نییە کە ئینقیادێکی تەواوت نەبێت.

{**أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ**} [12] ئایا حوکمی جاهیلیتان دەوێت؟.

یانی جیاوازی ناکەیت لەنێوان حوکمی قورئان و حوکمێکی جاهیلی و دەستکرد کە کەس نازانێ چۆن هاتووە وە دەڵێی خۆ من دەڵێم لا إله إلا الله!!!! .

---

[10] سورة لقمان آية ٢٢.

[11] سورة البقرة آية٨٥.

[12] سورة المائدة آية ٥٠.

5. پێنجەم مەرج لە مەرجەکانی لا إله إلا الله بریتیە لە **الصدق :**

دەبێت بە ڕاستگۆیانە ئەو وشەیە بڵێی، دەبێت ڕاستگۆیانە ئەو وشەیە تێتدا مەوجودبێت، دەبێت کارو کردەوەکان کە دەیکەیت ڕاستگۆیانە بێت نەك بە دووڕوییانە نەك بە درۆیانە بیکەیت، بۆیە مونافیقەکان ئەڵێردا دەرناچن و تێدەکەون، یانی مونافیق بۆی هەیە تا مەرجی پێنجەم هەر ئیمانی هەبێت بەڵام لە پێنجەمیاندا تێدەکەوێت و دەرناچێت چونکە دووڕو بە ڕاستیەوە ئەم وشەیە ناڵێت.

بۆیە پێغەمبەری خوا دەفەرموێت ﷺ [ ما مِن عَبْدٍ يَشْهَدُ أنَّ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ، وأنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ ورَسولُهُ إلَّا حَرَّمَهُ اللَّهُ علَى النَّارِ][13] هیچ بەندەیەك نییە کە ئەگەر بە ڕاستگۆیی ئەم وشەیە بڵێت ئیللا الله جل جلالە جەستەی ئەو کەسە لە ئاگری دۆزەخ حەرام دەکات.

6. شەشەم مەرج لە مەرجەکانی لا إله إلا الله بریتیە لە **الإخلاص :**

ئەو لا إله إلا الله کە دەیڵێی دەبێت ئیخلاصت هەبێت لە وتنیدا نابێت شیرکی تێدابێت، نابێت بە جۆرێك بیڵێی کەوا لا إله إلا اللهـەکە دەیان هەڵوەشێنەرەوەری تێدابێت و شیرکت تێدابێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت [ أسعدُ النَّاسِ بشفاعتي يومَ القيامةِ من قال لا إلهَ إلَّا اللَّهُ خالصًا من نفسِهِ][14] واتە بەختەوەرترین کەس بە شەفاعەتم لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو کەسەیە کە ئەیخلاصەوە بڵێت لا إله إلا الله.

7. حەوتەم مەرج لە مەرجەکانی لا إله إلا الله بریتیە لە **المحبة لهذه الكلمة و مقتضاياتها:**

خۆشەویستیت بۆ ئەو وشەیە هەبێت وە خۆشەویستیت بۆ هەڵگرانی ئەو وەشەیەش هەبێت وە بە پێچەوانەشەوە کە دەبێت دوژمنایەتی لەگەڵ ئەو کەسانەدا بکەیت کە دوژمنایەتی ئەم وشەیە و هەڵگرانی دەکەن.

بۆیە لێرەدا خەڵکێکی زۆر تێدەکەون، کەسی وا هەیە شەش مەرجی یەکەمی تێدایە بەڵام لێردا ئیمانی خۆی یەکلایی نەکردۆتەوە کە کێی خۆش دەوێت و کێی خۆش ناوێت، کە ڕقی لەکێیە و خۆشەویستی بۆ کێیە، پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێت [ أوثَقُ عُرَى الإيمانِ الحبُّ في اللهِ والبُغضُ في اللهِ ][15].

---

[13] صحيح مسلم ٣٢ / صحيح البخاري ١٢٨.

[14] أخرجه البخاري ٩٩.

[15] تخريج الإحياء للعراقي الصفحة أو الرقم : 199/2

[ومن يتول الله ورسوله .... فان حزب الله هم الغالبون ] ئەوانەی کە اللەیان خۆشدەوێت و پێغەمبەرەکەیان خۆشدەوێت و ئەوانەشی کە ئیماندارن، ئەوە ئەوکەسە لە خۆشەویستانی خوایە وە ئەوانەش سەردەکون کە هەڵگری ئەم پەیامە ڕاستەن کە هەڵگرانی ئەم لا إله إلا اللەیەن کە خۆشەویستان ئەم لا إله إلا اللەیەن.

[ **وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ** ][16] پێچەوانەکەی ئەوەیە کە دوژمنانی ئەم لا إله إلا اللەیەت خۆشبوێت، الله جل جلالە دەفەرموێت هەر کەسێکیش لەئێوە ئەوانەی خۆشبوێت کە دوژمنی لا إله إلا اللەن ئەوە تۆش لەوانی، هەرچەندە مەرجەکانی ترت تێدا مەوجود بێت بەڵام ئەم مەرجی حەوتەمە کە دەبێت خۆشەویستیت بۆ لا إله إلا الله هەبێت وە خۆشەویستیت بۆ هەڵگرانی ئەم وشەیە هەبێت کە بە ڕاستەینە و بە موحدی هەڵیانگرتووە ئەوکاتە تۆ ئیمانت تەواوە وە ئەگەرنا تۆ ئیمانت تەواو نابێت ئەگەر سەد هەزار جار بڵێیت لا إله إلا الله دوژمنێکی ئەم وشەیەت خۆشبوێت ئەوە تۆ هەڵوەشێنەرەوەی ئەم وشەیەت تێدایە و ئەم لا إله إلا الله سودێکت پێ ناگەیەنێ لە ڕۆژی قیامەت.

وصل الله على محمد وعلى آله وصحبه وسلم

(16) سورة المائدة آية ٥١.